

زنجیره ڕێنمای بۆ گەنجان

# حوکمی گۆرانی و مۆسیقا

بەبەڵگەی قورئان و سوننەت و وتەی زانایان


- ئامادەکردنی بیلال سەرکەوت
- دیزاینی بەرگ سوڵتان محمد

# حوکمی گۆرانی و مۆسیقا

## بەبەڵگەی قورئان و سوننەت و وتەی زانایان

**إِنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذً بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ... أَمَّا بَعْدُ:**

## پێشەکی

زۆرێك لە خەڵکی خۆیان داوەتە گۆرانیو مۆسیقا، بەڵکو دەڵێن دڵو دەروونی مرۆڤ ئارام دەکاتو دەی حەسێنێتەوەو هەست دەجوڵێنێتو نەخۆشی خەمۆکی لادەباتو... هتد، بێگومان ئەمەش ڕاست نییە، چونکە خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا ڕوونی کردووەتەوە کەقورئان گەورەترین نیعمەتی خوایە بەخشیویەتی بەمرۆڤ، وە

ئارامی‌و ئاسوده‌یی دونیاوقیامه‌تی بۆ دێنێ، ده‌فه‌رمووێت: [الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ أَلا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ] (الرعد 28).

واته: ئه‌وانه‌ی باوه‌ڕیان هێناوه دڵ‌و ده‌روونیان ئارام ده‌بێت به قورئان‌و په‌یامه‌كه‌ی په‌روه‌ردگار، كه وایه ئاگاداربن دڵه‌كان ته‌نها به‌قورئان‌و یادی په‌روه‌ردگار ئارام ده‌گرن.

بۆیه لێره‌وه ده‌ڵێم ئه‌ی موسڵمانی خۆشه‌ویست: هه‌ركه‌سێك گومان‌و دوو دڵی هه‌یه له حه‌رامی گۆرانی‌و مۆسیقا، ئه‌وا با گومانه‌كه‌ی لابدات‌و فه‌رمایشته‌كه‌ی خوای په‌روه‌ردگار وه‌ربگرێت‌و دوودڵی نه‌مێنێت له حه‌رامێتیدا، چونكه به‌دڵنیایی ئایه‌ته‌كانی قورئان‌و فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ر «صلی الله علیه وسلم» زۆر هاتووه له‌سه‌ر حه‌رامی‌و گوێگرتن لێی، به‌ڵكو به‌و په‌ڕی دڵنیاییه‌وه ده‌ڵێم هه‌ڕه‌شه‌ی توند كراوه له‌و كه‌سانه‌ی كه به‌حه‌ڵاڵی ده‌زانن، جا موسڵمانی یه‌ك خواناس‌و شوێن كه‌وته‌ی قورئان‌و سوننه‌ت ته‌نها یه‌ك به‌ڵگه‌ی له قورئان‌و سوننه‌ت به‌سه بۆ ئه‌وه‌ی بزانێت كه حه‌رامه، وه با هه‌موومان ئه‌وه‌مان بیر نه‌چێت كه خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێت: [ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَنْ يَكُونَ لَهُمْ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلالاً مُبِيناً] (الأحزاب 36).

واته: بۆ هیچ پیاو ئافرەتێکی موسڵمان نییە، کاتێك خواو پێغەمبەرەکەی «صلى الله عليه وسلم» بڕیاری شتێك بدەن، ئەوان سەر پشك بن لە ئەنجامدانی ئەو شتەدا، چونکە بەڕاستی ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی «صلى الله عليه وسلم»، ئەوا گومڕاو سەر لێشێواوی ئاشکرا خۆیەتی.

لێرەوە با هەمووومان پێکەوە بزانین ترسناکیو زیانەکانی گۆرانیو مۆسیقا چییە لە ژێر ڕۆشنایی (قورئانو سوننەتو وتەی زانایاندا)

## یەکەم ـ خـوای گـەورە حەرامی کردووە دەفەرمووێت

وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ } ( وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ}( سورەلقمان6

''هەندێک لە خەڵکی هەن قسەی بێ خێر و بێ مانا دەکڕن (وەک گۆرانیە ناپوختەکان، کتێب و شریتە بێ خێرەکان... هتد) تا خۆی و کەسانی تریش لە ڕێبازی خوا وێڵ بکات، بێ ئەوەی هەست بکات بەمەترسی کارەکەی و بزانێت چ کەتنێک دەکات بە خۆی و خەڵکی و بۆیە ئەو شتە بێ نرخو خێرانە دەکرێت تا گاڵتە بە پەیام و ڕێبازی خوا بکات، ئا ئەوانە سزا و تۆڵەیەکی ڕیسواکەرو ئابڕووبەر چاوەڕێیانە'' هاوەڵی خۆشەویست عبدالله ی کوری مسعود (خوای لێ رازی بێت )فەرموویەتی

پرسیاریان لێ کردم (لَهْوَ الْحَدِيث)ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی سوێند مەبەست پێ گۆرانیە سێ جار ئەمەی دووبارە کردووە بەخوا

دووەم ـ پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی (ليكونن من أمتي أقوام يستحلون الحر والحرير والخمر والمعازف ) رواه البخاري.واتە: لە ئـومەتی مندا کەسانێک پەیدا دەبن داوێن پیسی و ئاوریشم و ئارەق و موسیقا بەحەڵاڵ دەزانن حەلای دەکەن هەروەها سەبارەت بە گۆڕانی هاوەڵی خۆشەویست معاویە (خوای لێ رازی بێت) فەرموویەتی:(أن رسول الله ﷺ نهى عن النوح....الغناء. واتە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: نەی کردووە لە شیووەن کردن بۆمردوو ..... هەروەها نەهی کردووە لە گوێگرتن لەگۆرانی وەگۆرانی وتن.

سێیەم ـ ئـەوەی گـۆرانـی دەڵێـت نـەفامـە و نـەزانە

پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: ( نَهَيْتُ عَنْ صَوْتَيْنِ أَحْمَقَيْنِ فَاجِرَيْنِ : وفى روايه، ملعونان. صَوْتِ نَغْمَةٍ لَهْوٍ وَلَعِبٍ وَمَزَامِيرِ الشَّيْطَانِ ، وَصَوْتٍ عِنْدَ مُصِيبَةٍ ، وَخَمْشِ وُجُوهٍ ، وَشَقِّ جُيُوبٍ)واتە: رێگریم لێکراوە لەدوو سەووتی نەزان خراپ، لەریوایەتێکی تردا.نەفرەت لێکراوە. دەنگێک لەگەڵ ئاوازو موسیقاو زۆرنا لەکاتی خۆشیدا . وەدەنگێک لە کاتی بەڵاو موصیبەتدا بەلێدان رەنێنی دەم وچاو یەخە.

**چوارەم - گۆرانی و موسیقا ئاوازی شەیتانە**

جارێکیان لەڕۆژی جەژندا ابوبکر (خوای لێ رازی بێت) چوو بۆ ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ دووکەنیزەک گۆرانیان دەووت لای عائیشە (خوای لێ رازی بێت) فەرمووی (مَزَامِيرِ الشَّيْطَانِ فى بيت رسول الله ﷺ)واتە: ئەو ئاوازی شیتانە نە لە ماڵی پێغەمبەری خوادا ﷺ لێ دەدرێت. فەرمووی " دَعْهُمَا يَا أَبَا بَكْرٍ فَإِنَّهُ يَوْمُ عِيدٍ "وفی روایە. لیستا بمغنیتین واتە: وازیان لێ بێنەی ئەی ئەبوبکر چوونکە ڕۆژانی جەژنە. لەگۆیەکی تردا ئەوان گۆرانی بێژنین، بەڵکو یاری دەکەن.

**پێنجەم - شەیتان حەزی لەگۆرانییە**

جارێکیان عمری کوری خطاب(خوای لێ رازی بێت)بەلای کیژۆڵەیەکی بچوکدا تێپەڕی گۆڕانی دەووت :عمر (خوای لێ رازی بێت) فەرمووی(لَوْ تَرَكَ الشَّيْطَانُ أَحَدًا تَرَكَ هَذِهِ )واتە: ئەگەر شیتان وازی لەکەسێک بهێنایە، ئەوا لەم کیژۆڵەیە دور دەکەوتەوە وازی لێ دەهێنا

**شەشەم - گۆرانی هۆکارە بۆ توڕەبوونی خوای گەورە**

پێشەوا ضحاک (رەحمەتی خوای لێ بێت)فەرموویەتی (الغنـــــاء مــــــسخطه للــرب)واتە: گۆرانی هۆکارە بۆ توڕەبوونی خوای گەورە،هەرکەسێکیش خوای گەورە لێ تورەبێت بەدبەخت چارە رەش دەبێت.

**حەوتەم ـ گۆرانی هـۆکاری پیس بوون خـراپ بـوونی دڵە**

پێشەوا ضحاک (رەحمەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی(الغناء مفسدة للقلب)واتە:گۆرانی موسیقا هۆکارە بۆ پیس بوون خراپ بوونی دڵ دەروون.

**هەشتەم ـ گۆرانی پاڵنەرە بۆ داوێن پیسی**

پیشەوا فضیلی کوری عیاض(رەحمەتی خوای لێ بێت)فەرموویەتی(الغناء رقیة الزنا)واتە:گۆرانی پاڵنەرە بۆ داوێن پیسی راکێشەرە بۆ داوێن پیسی.

**نۆیەم ـ گۆرانی شـەرم حـەیا کـەم دەکـاتەوە**

پێشەوە یەزیدی کوری ولید(رەحمەتی خوای لێ بێت)فەرموویەتی(إیاکم والغناء ، فإنه یُنقص الحیاء)واتە: ئاگادارتان دەکەمەوە بەوەی خۆتان بپارێزن لە گۆرانی ، چونکە شەرم حەیا کەم دەکاتەوە نای هێڵێت

**دەیەم ـ گـۆرانـی هەواو ئارەزوی جنسی زیاد دەکات**

پێشەوە یەزیدی کوری ولید(رەحمەتی خوای لێ بێت)فەرموویەتی(إیاکم والغناء ،فإنه یزید في الشهوة )واتە: ئاگادارتان دەکەمەوە بەوەی خۆتان بپارێزن لە گۆرانی ، چونکە هەواو ئارەزوی جنسی زیاد دەکات.

**يانزەيەم - گـۆرانی چاکەو پیاوەتی ناهێڵێت**

پێشەوە یەزیدی کوری ولید(رەحمەتی خوای لێ بێت)فەرموویەتی(إياكم والغناء ،فإنه يهدم المروءة)ئاگادارتان دەکەمەوە بەوەی خۆتان بپارێزن لە گۆرانی ، چونکە چاکە و پیاوەتی نـــاهێڵێـت.

**دوانزەیەم - گۆرانی شەیتان بەکاری دێنێت بۆ گومراکرنی خەڵکی**

خوای گەورە دەفەرمووێت(وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ)واتە:ئەی شەیتان هەرکەس لە ئەوانە،کە دەتوانیت ،بەدەنگی خۆت هانیان بدە زۆرینەی زانایان لێرەدا دەفەرموون :مەبەست گۆرانی زورنا موسیقایە. خوای گەورە دەفەرمووێت شەیتان وتی (لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ إِلَّا قَلِيلًا ( 62 ) واتە:سوێند بە خوا ئەگەر دوام بخەیت تا ڕۆژی قیامەت ئەوە بێگومان هەموو نەوەکانی گومڕاو سەرگەردان دەکەم جگە لە کەمێکیان (کە دەسەڵاتم بەسەریاندا نیە بەندە صالحەکانە). خوای گەورە دەفەرمووێت شەیتان وتی(قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ) (ص 82 )

ئینجا شەیتان وتی: سوێند بەدەسەڵاتی بێ سنوورت شەرت بێت هەر هەموویان گومڕاو سەرگەردان بکەم.

سیانزەیەم ـ هەرکەسێک خوو بەگـۆرانیـەوە بگرێت خراپەکارە

پێشەواوی پایەبەز ئیمامی مالیک(رەحمەتی خوای لێ بێت)فەرموویەتی( (إنما يفعله عندنا الفساق)واتە:لای ئیمە تەنها خراپەکاران خەریک ئەو کارەن.

چواردەیەم ـ هەرکەسێک خوو بەگۆرانیەوە بگرێت، ئەوا شایەتی وەرناگرێت رەت دەکرێتەوە

پێشەواوی پایەبەز ئیمامی شافعی(رەحمەتی خوای لێ بێت)فەرموویەتی(أنّ الغناء لهوٌ مكروه، يشبه الباطل، ومن استكثر منه فهو سفيه ترد شهادته،)واتە:گۆرانی بێ هودە ناپەسەندە و بێ هودەیە ، هاوشیوە لێکچوو نەرەوایی و ناحەق و ساختەییە. هەرکەس زادەرووەی تێدا بکات خۆی پیوە بگرێت. ئەوا گەمژەو نەفامە نەزانە شایەتیدانی .رەت دەکرێتەوە لێ وەر ناگیرێت

## چـارەسـەری چـیە بۆ ئەوکەسانەی ناتوانن واز لە گوێ گرتن لە گۆرانی و گۆرانی وتن بهێنن

کۆمەڵێک رِێگە هەیە بۆ ئەوکەسانەی دەیانەوێت واز لە گۆرانی و گوێ گرتن لەگۆرانی بێنن

یەکەم ـ توبەکردن

بەوەی بگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورە توبەیەکی نەصوح بکەیت. خوای گەورە دەفەرمووێت(وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَىٰ مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ )(ال عمران 135 )

ئەوانەش کە تاوان یان گوناهێک ئەنجام دەدەن، یاخود ستەم لە خۆیان دەکەن (دوایی بە خۆیاندا دێنەوەو سزای) خوا دێتەوە یادیان، ئەوسا داوای لێخۆشبوون دەکەن، جا کێ هەیە کە لە گوناهان خۆش ببێت جگە لە خوا؟! هەروەها لەسەر گوناهو تاوانیان بەردەوام نابن، لە کاتێکدا دەزانن (ئەوە تاوانە).

دووەم ـ دوعاو پارانەوە لەخوای گەورە

پێویستە لەخوای گەورە بپارێتەوە تاکو لەو بەڵایە بت پارێزیت.جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺبە موعاذی فەرموو ئەی موعاذ سوێند بەخوا تۆم خۆش دەوێت ، بۆیە هەمیشە لەدوای نوێژەکانت بڵێ (اللَّهُمَّ أعِنَّا عَلَى ذِكْرِكَ، وَشُكْرِكَ، وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ)واتە: ئەی خوایە.یارمەتیم بدە لەسەر ئەوەی یادی تۆ بکەم بەجوانی سوپاست بکەم بەجوانی بت پەرستم.

**سێیەم** ـ دورکەوتنەوە لەوکەسانەی گۆرانی دەڵێن و گوێی لیٚ دەگرن

چونکە لەگەڵ هەر کەسێکدا هەڵس وکەوت بکەیت بیکەیت بەهاوڕیٚ خۆت ئەوە تۆیش وەک ئەو سیردەکرێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی(الْمَرْءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلْ)واتە: مرۆڤ لەسەر دین رەوشتی خۆشەویستەکەیەتی جا با هەریەک لەئیوە بزانیٚ هاورێیەتی کیٚ دەکات.

**چوارەم** ـ لەناو بردنی هەوو کاسێتە گۆرانییەکان

**پێنجەم** ـ پەیوەست بوون بەزیکری خوای گەورە بەتایبەت قورئان خوێندن

**شەشەم** ـ بیرکردنەوە لەتاوانی گۆرانی وتن گویٚ گرتن لێی

**حەوتەم** ـ بیربکەوە کاتێک گویٚ لەگۆرانی دەگرێت ئـایا ئاسوو دەیت

**هەشتەم** ـ پێویستە زاڵ بیت بەسەر نەفسدا ڕیگەی نەدەیت توشی تاوانت کات

جیاکردنەوەیک لە گۆرانی

هەردوو زانای پایەبەرز (ابن القیم الجوزی و شیخی ئەلبانی)(رەحمەتی خوایان لیٚ بێت) فەرمووویانە، سروود بەبیٚ ئامێرەکانی موسیقا دروستە

لە هەندێک حالەتدا کە ڕێگەی پێ دراوە بەبێ هیج زیادەرەویک،ئەو حاڵەتانیش ئەمانەن

یەکەم ـ سروود وتن لەکاتی ژن هێناندا،وەدەف لێدان ئەمەیش تاییەتە بە جاریەو کەنیزە

دووەم ـ سروود ووتن بۆ لێخورینی وشتر و گورج کردنەوەی

سێیەم ـ سروود وتن بۆ حەسانەوە نەمانی بێتاقەتی، ئەویش هاوەڵەکان لە غەزای خەندق دەیان وت

چوارەم ـ سروود وتنی کاراونی حاجیان دەڵێن لەکاتیچوون بۆ حەج ، ئەویش وەسفی مەدینەو مـەکە و کەعبە و زمزم دەکەن

## ئایا سروودی ئاینـی دروسـتە؟

سروودی ئاینـی دروسـتە بەڵام بەمەرجێک لەم چەند خاڵانەی خوارووە تێ نەپەڕێت زیادەڕووەی تێدا نەکرێت.

یەکەم ـ دەبێت وشـەو رستەکان ئاینی بێت

دووەم ـ نابێت بەدەنگی ئافرەت بێت

سێیەم ـ نابێت بەسەر ئافرەتدا بوترێت

چوارەم ـ نابێت دەف و زۆرناو هەموو ئامێرەکانی موسیقای تێدابێت

پێنجەم ـ نابێت هۆکارێک بێت بۆوازهێنان لە قورئان خوێندن زیکر یادی خوا

شەشەم ـ نابێت هۆکار بێت بۆ فەوتاندنی نوێژە فەرزەکان

حەوتەم ـ بابێت خۆچواند بیت بە بیٚ باوەرانەوە

هەشتەم ـنابێت باسی عیشق و خۆشەویستی بکات

نۆیەم ـ نابێت تێکەڵاوی پیاوان ئافرەتانی تێدابێت

دەیەم ـ نابێت تایبەت بکرێت بەهیج حیزب و لایەنێک

موسڵمانی خۆشەویست :ئەوەی دەبێت هەمیشە بیخەینە پێش چاومان ئەوییە کە وەک گەشتیارێک واین لەم دنیایەدا.دەگوازرێنەوە بۆ قیامەت بۆیە ڕێگایەکی دوورٍ نارەحەتە.وە پێویستە توێشویک ئامادەکین بۆ ئەو گەشتە.ئەویش بریتییە لەتەقوای خوای گەورە، بێگومان خوای گەورە بیٚ هۆ ئیمەی دروست نەکردوە بەڵکو ئیمەی بۆ عیبادەت دڕوست کردووە خوای گەورە دەفەرموویێت (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ )( الزاريات56 ) بێگومان من جنۆکە و ئادەمیزاد م دروست نەکردووەتەنها بۆ ئەوەنەبێت کەمن بپەرستن و فەرمانبەردارم بن.جابۆیە تۆ بۆ ئەو

دروست نەکراوێت بۆ کەیف سەفا بەڵکو تۆ بۆ خواپەستی دڕوست کراویت ، بۆیە ئەی خوشک برای موسڵمانان من تۆ بۆ ئەو دڕوست کراوین عیبادەتی خوا بکەین بۆیە تەقوای خوابکەن ئەی ئەوکەسانەی گوێ لەگۆڕانی دەگرن گۆڕانی دەڵێن بزانن بەراستی ئەوی گوێگرتن لە ئاوازی شەیتان بەدبەخت و نەهامەتی دوارۆژی بەداوییەت بۆ بابگرێنەوە بۆ لای کتابەکەی خوا سونەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ چونکە بەراستی سەربەرزیمان لەودایە هەوڵدەین توێشویک ئامادەکەین بۆ قیامەتمان هەرکەسێک فەتوای گۆڕانی حەلال کردنو گوێ گرتن بەحەلال دەزانی حەلالی دەکات بۆ خەڵکی ئەو کەسێکە بەبێ هیج بەڵگەیەک ئەو قسە دەکات هیج بەڵگەیک نیە لەسەر دروست بوونی ئەوکارە.

لەکۆتایدا لەدوعای خێر بێ بەشمان مەکەن وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.

ئامادەکردنی بیلال سەرکەوت